نەبەز حەمە رەشید

# هونەرە جوانەکان



# لە شارستانیەتی ئیسلامیدا





# هونەرە جوانەکان

## لە شارستانیەتی ئیسلامیدا

نەبەز حەمە رشید

چاپی یەکەم

٢٠٠٢ ز

١٤٢٣ ك

## بەناوی خوای جوانکاری بوونەوەر

ناوی نامیلکە : ﴿هونەرە جوانەکان لە شارستانیەتی ئیسلامیدا﴾
ناوی نووسەر : نەبەز حەمە رشید
ساڵی چاپ : ١٤٢٢ ك ـ ٢٠٠٢ ز
نۆرەی چاپ : یەکەم
تیراژ :
ژمارەی سپاردن : ژمارە ( ٢٥٧ )ی وەزارەتی رۆشنبیری دراوەتێ .
نەخشەسازی بەرگ : کۆمپیوتەری رۆشنبیر
بڵاوکار : لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی رۆشنبیر
سلێمانی ـ بازاڕی ڕا پەڕین

﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى
الأَرْضِ زِينَةً لَهَا لِنَبْلُوَهُمْ
أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً ﴾

الكهف/٧

# دەستپێك

نەتەوەی ئیسلام هات باشترین و چاکترین نەتەوەی هەڵبژێرراو، کە باوەڕیان بەخوای گەورەو پێغەمبەرەکەیی‌و کتێبەکانی و ڕۆژی دوای هەیە، فەرمان ئەکەن بە چاکەو قەدەغە ئەکەن لە خراپە ، وە یەکەم نەتەوەن کە هێزی ئیمان و خۆشەویستی زانستیان پێکەوە گرێداوە.

ئەم بیروباوەڕە تەشەنەی کرد ، شارستانیەت بنیادنراو دنیای پێ ڕووناك بووەوە لەکاتێکدا دنیا لە تاریکاییی‌و بێهیوایی دابوو.

گومانی تێدا نی‌یە کە نەتەوەی ئیسلام باوەڕێکی زۆریان بە زانست‌و زانیاری هەیە، لە خەلیفەی موسڵمانەوە تا سادەترین هاولاَتی ، بەم پێیە موسڵمانان هەموو قوتابی زانستن‌و زانست‌و زانیاری لایان گەورەترین توانایەو بەرزترین پلەو پایەیە ، وە زانایان خاوەنی پلەوپایەی بەرزن لای خواو پێغەمبەی خوا ﷺ هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿قل هل يستوي الذين يعلمون والذين لا يعلمون﴾ هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت (العلماء ورثة الانبياء) یان (فضل عالم على العابد كفضل القمر ليلة البدر على سائر الكواكب) هەروەها زانایان لای خەلیفەو والی‌و خەڵکیش جێی ڕێزو قەدر گرتن بوون.

لەم کەشەدا زانایان سەرقاڵی توێژینەوە بوون بەمەش ڕاپەڕینێکی زانستی لەهەموو بوارەکانی زانست‌و زانیاری دەستی‌پێ‌کرد، زانست پێشکەوت ، زانا موسڵمانەکان لە گۆڕەپانی زانست‌و زانیاری‌دا بەتەنها پێشڕەوو دیارن لەو زانایانەش (ابن سینا لە زانستی پزیشکی‌دا ، بیرونی لە فەلەکدا ، حسن کوڕی هیثم لە فیزیادا ، جابری کوڕی حەییان

له کیمیادا ، ابن البیطار له رووەك ناسیدا، فارابیو ابن رشد له فەلسەفەدا ، خوارزمیو ثابت ابن قرة له بیرکاری ، زریاب و صفیالدین الارموی له مۆسیقادا ، واسطي له وێنەکێشاندا).

ئەمانەو چەندانی تریش که له ئاسمانی شارستانیەتی ئیسلامیدا دیارنو کاریگەری بەرچاویان بەسەر شارستانیەتی رۆژئاوای ئێستاوە هەیە .

ئەوەی جێی باسە شارستانیەتی ئیسلامی لەسەر بناغەی لێبوردنی دینیو نەبوونی هەڵچوون و خۆ فەرز کردن بنیاد نرا ، ئەم لێبوردنە دینیيە بووە هۆی یاریدەدەر لەسەر کۆبوونەوەی رواڵەت و وێناکانی گشت شارستانیەتە کۆنەکان تاکو ببێتە سەرەتایەك بۆ لایەنی ماددی له شارستانیەتی ئیسلامیدا " که له دەوروبەرە جوگرافیە جیاجیاکان بلاو بووەوەو هەموو ئەو توخمە جیاوازانەی له خۆگرتبوو که سەرچاوەکان بە ئەو بەرەو ژوور چوونە مادی و شارستانیەتەیان بەخشی.

بەلام ئەوەی تائێستا لای زۆربەی هەرەزۆری رۆشنبیران و خوێنەران و هونەرمەندان و تەنانەت ئیسلامیەکانیش شاراوەیە، باسی هونەرە جوانەکانە له شارستانیەتی ئیسلامیدا که تاخوێندنەوەی ئەم بابەتەش رەنگە لایان نامۆ بێت ، چونکە نووسەرانی کورد هیچ ئاوڕدانەوەیەکی بەرچاویان لەم بوارە نەداوەتەوەو نوسەرە عەرەب و فارس و تورکەکانیش لەژێر ناوی هونەری عەرەبی و فارسی و تورکی ناویان بردووەو کردوویانەتە بەشێك له کەپورو فەرهەنگی نەتەوەیی خۆیان ،

زۆر کەمیان نەبێت چاویان بەرایی نەهاتووە بەناوی هونەری ئیسلامی ناوی بەرن.

زانستی هونەرە جوانەکان لە شارستانیەتی ئیسلامیدا هەروەك هەموو زانستەکانی دی بەرەو پێشچوونێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی . موسوڵمانان لە ژێر سێبەری چەندین ئایەتی پیرۆز کە راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ هانی موسڵمانان دەدات تا بە وردی و تێڕامانەوە لە دروستکراوەکانی خوای گەورە بڕوانن‌و هەست بە جوانی و دەست ڕەنگینی خوای جوانکار بکەن لەو ئایەتە پیرۆزانەش:

﴿انا جعلنا ماعلى الارض زينة لها لنبلوهم أيهم أحسن عملا﴾ الكهف / ٧

﴿افلم ينظروا الـى السمـاء فـوقهم كيف بنيناها وزيناها﴾ ق/٦

﴿ولـقد جعلـنا في السمـاء بروجـاً و زيناها للناظرين ﴾ الحجر/١٦

﴿قـل من حـرم زينـة الله التـي اخـرج لـعبـاده﴾ الاعراف /٣١

﴿والانعام خلقها لكم فيها دفـٌء ومنافع ومنها تاكلون (٥)

ولـكـم فيهـا جمـالٌ حين تريـحون وحين تسرحون﴾ النحل/٥-٦

﴿مـا كـانوا يستطيعـون السمـع وما كـانوا يبصرون﴾ هود/٢٠

﴿انـا زينـا السمـاء الدنيـا بزينـة الـكـواكب﴾ الصافات/ ٦

لێرەدا وشەی (زینە) یان (جمال) بە واتای جوانی‌و ڕازاندنەوە دێت، کە بەزاراوە هونەرییەکەی واتە (ئێستاتیکا)، کە خوای گەورە مەبەستێتی سەرنجی مرۆڤەکان بەگشتی بۆ (جوانی) ڕاکێشێت، کە هەم بەڵگەیەکی ترە لەسەر دەسەڵاتی گەورەیی زاتی پیرۆزی ، هەم (جوانی) یەکێکە لەوانەی کە خوای گەورە خۆشی ئەوێت هەروەك پێغەمبەر ﷺ

دەفەرموێ : (ان الله جميل يحب الجمال)[1]رواه مسلم لێرەدا خوای گەورە جوانەو جوانی خۆش دەوێت خۆشەویستییەکەشی ئەو موسڵمانانەش دەگرێتەوە کە خەریکی جوانیو جوانکارین.

وە هونەرو جوانی یەکێکە لەبەخششە خواییەکان بۆ ئەهلی بەهەشت ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذواتـــا افنـــان﴾ایە (٤٨/الرحمن) لێرەدا (افنان) لەمشتەقاتی (هونەر ـ فن) ە کە خوای گەورە وەصفی دارێك دەکات لە بەهەشتدا کە پەل و پۆو گەڵاکانی ناسك و ڕازاوەو ڕەنگاو ڕەنگ و بریسکەدارن ، وە پێغەمبەر لە فەرموودەیەکیدا دەربارەی ئەو دارە دەفەرموێت: روی ابن اسحاق ان رسول الله ﷺ ذكر في سدرة المنتهى قال : (يسير في ظل الفنن منها الراكب مائة سنة) رواه الترمذي. (سێبەری ئەو دارە (فنن) بەرامبەرە بەرۆشتنی (١٠٠) ساڵی سوارچاکێك بە ژێریدا).

بەم پێیە دەتوانین بڵێن قورئان هەروەك چۆن پەروەردەی (هزری و عەقلی و دەروونی و سیاسی و رەوشت ...هتد) مان دەکات بەهەمان شێوە پەروەردەی چێژیشمان (ذوق) دەکات.

لەم تێڕوانینەوە زانستی هونەر لەشارستانیەتی ئیسلامیدا هەر لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ کە بەگەورەترین هەنگاو دەستی پێکرد ئەویش ڕزگار کردنی هونەر بوو لە دووتوێی بت پەرستیداو بەکارهێنانی وەك هونەرو چێژو خزمەت بەفکرو بیروباوەڕ.

---

[1] صحيح مسلم ص٩٣.

پاشان لەسەردەمی خەلیفەكانی راشدین‌و ئومەوی و عەبباسی و عوسمانیەكاندا زیاتر هەڵچوون و پێشكەوتنی بەخۆیەوە بینی، وە موسڵمانان مومارەسەی هونەریان دەكردو جێی گرنگی خەلیفەكانیش بوو ، وەهونەر بەشێوەیەك گەشەی كرد كە لەوكاتەدا چەندین قوتابخانەی هونەری لە بواری (مۆسیقا ، شێوەكاری) ئامادەیی هەبوو ، وە ژمارەیەكی زۆر مامۆستای هونەرمەندی ناودار وانەیان تیا وتۆتەوە.

لێرەدا نامەوێت باسی هونەر لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفەكانی راشدین بكەم ، چونكە نوسراوو كتێب‌و نامیلكە لەسەر حەڵاڵ‌و حەرامی مۆسیقاو وێنەكێشان زۆرە كە زۆربەی هەرەزۆری فەرمودەكانی پێغەمبەری ﷺ بە راڤەكراوی لەخۆگرتووە.

بەڵكو زۆر بەكورتی تیشك ئەخەینە سەر ئەو كارو ئەزمونە هونەریانەی كە موسڵمانان بەدرێژایی مێژووی شارستانیەتی ئیسلامی لە سەردەمی خەلافەتی دەوڵەتەكانی ئومەوی و عەبباسی و عوسمانی‌دا بەرهەمیان هێناوەو مومارەسەیان كردووە.

# هونەری مۆسیقا

## لە سەردەمی ئومەویەکاندا:

گۆرانی گەشەکردنێکی بەخۆیەوە بینی بەجۆرێك قوتابخانەی هونەری گۆرانی تێدا دروست بوو بۆ نمونە قوتابخانەی گۆرانی لە مەککەی پیرۆز کە (ابن سریج) دامەزرێنەری بوو . هەروەها قوتابخانەی گۆرانی لەمەدینەی شاری پێغەمبەر ﷺ کە (معبدی کوری وەهب) دامەزرێنەری بوو وە ئەم دوو قوتابخانەیە پێشبڕکێیەکی گەرمیان لەنێواندا بوو.

لەگێڕانەوەیەکدا خاوەنی کتێبی (مروج الذهب) ج٣ لا ١٨٧ ئەڵێت : (خەلیفە عومەری کوڕی عبدالعزیز زۆر ئاسانکاری بۆ ئەهلی مۆسیقاو گۆرانی کردووە بەڕادەیەك قسە هەیە کە خەلیفە خۆی بەیەکەم خەلیفە دادەنرێت کە ناوبانگی لەدەنگ خۆشیو گۆرانیدا هەبووە) وە ئەشڵێن حەوت (٧) ئاوازی دانراوی خۆی هەبووە .

هەروەها لەناودارانی گۆرانیو مۆسیقا (ابن عائشە) کە گۆرانی بێژی خەلیفەکان بووە پاشان (عمر الوادی) کە بە ئەندازیاری گۆرانی وتن دادەنرێت بەهەمان شێوە (ابن محرز) یەکێکە لە ناودارانی ئاوازو گۆرانی کە بەیەکێك لە سێ ناودارانی گۆرانی ئیسلامی ناوزەد کراوەو لە بارەیەوە ئەڵێن توانیویەتی چەندین ئاواز لە چوارچێوەی یەك گۆرانیدا دابڕێژێت.

# لەسەردەمی عەبباسیەکاندا

لەم سەردەمەدا گۆرانیو مۆسیقا پێشکەوتنێکی زێرینو گەورەی بەخۆیەوە بینی بەشێوەیەك توانرا پێشنیاری چەندین تیۆرو ئامێری مۆسیقی تازە بکرێت و کاریگەری بەسەر شارستانیەتی ئێستای ئەوروپاوە بەجێ بهێڵێت.

یەکەم خەلیفەی عەبباسی کە حەزی بەمۆسیقاو گۆرانی ئەکرد (خەلیفە مەهدی) بوو (٧٧٠ز-٧٨٥ز) کە (ابن خلکان) لەبارەیەوە ئەڵێت (کان من احسن الناس صوتا) پاشان (خەلیفە هادی) کوڕی گرنگی بۆ مۆسیقاو گۆرانی لەگرنگی باوکی کەمتر نەبوو .

لە سەرەتاکانی سەردەمی خەلافەتی عەبباسی‌دا ناودارانی گۆرانیو مۆسیقا خۆی لەمانەدا ئەبینیەوە (مالك بن ابی السمع) ناسراو بە (المدنی) کە قوتابی (معبد کوری وەهەب)ی دامەزرێنەری (قوتابخانەی مەدینەی شاری پێغەمبەر)ە. هەروەها گۆرانی بێژ (عبدالله بن وهب المکی) ناسراو بە (سیاط) .

شایانی باسە گۆرانی بێژ (عبدالرحمن بن عمر المدنی) ناسراو بە (بن رحمان) توانی کاری چاکسازی و گۆرانی بەیەکەوە گریێ بدات .

دواتر لە ناوەراست و کۆتایی سەردەمی عەبباسیەکاندا لە ناوبانگترین (گۆرانی بێژ ، مامۆستا ، مۆسیقا ژەن ، ئاواز دانەر) دەرکەوتن ، کە بەڕاستی توانیان زانستی مۆسیقاو گۆرانی لە ڕووی تیۆرو پراکتیکەوە بەرەو پێش بەرنو ، کاریگەری بەرچاو لەسەر هونەری ئیسلامی ڕۆژهەلاتی بەجێ بهێڵن .

لەو ناودارانەش (ابن جامع) کە بە ڕەچەڵەك قوڕەیشی‌یە، دوای ئەوەی ڕۆشنبیرییەکی فراوانی لەسەر (فقه ، حفظ القران) بە دەست هێنا ، دوای مردنی باوکی لە لای باوەپیارەکەی دەستی کرد بە خوێندنی مۆسیقا ، یەکێکە لە مۆسیقارە بەناو بانگەکان‌و منافسی (ابراهیم موصلی) بووە. لە خەلیفە (هارون الرشید) یان پرسی: ڕات چی‌یە لەسەر دەنگ‌و گۆرانی و مۆسیقاکانی (ابن جامع)؟

لە وەڵامدا وتی: (وما اقول فی العسل) .

پاشان لەو قوتابخانە بەناوبانگانەی بغداد بۆ گۆرانی و مۆسیقا (قوتابخانەی ابراهیم موصلی)یە کە خاوەنی زیاتر لە (٩٠٠) ئاوازەو مامۆستاو مۆسیقاژەن‌و ئاوازدانەری ناوداری جیهانی ئیسلامی بووە لەو سەردەمەدا ، خەلیفە (هارون الرشید) کردویەتیە گۆرانی بێژی تایبەتی خۆی و کۆشکی خەلافەت دوای ئەمیش (اسحاق موصلی) کوڕی ابراهیم موصلی جێی باوکی بەزیادەوە گرتەوەو سەرەڕای کاری هونەری داهێنەرانەی خۆی تەواوکاری کارە هونەرییەکانی قوتابخانەی باوکی بووەو (٤٠) کتێبی لەسەر مۆسیقا داناوەو لە ئەدەب‌و فەلسەفەو دادوەریشدا شارەزایی هەبووەو توانیویەتی لە کۆڕو کۆبوونەوە ڕەسمیەکانی کۆشکی خەلافەت بەشداری بکات ، بەفەرمانی خەلیفە (مأمون) لەڕیزی ئەدیب‌و زانایان دانیشتووە نەك لەڕیزی مۆسیقا زاناندا کە پلەیان خوارتر بوو، کاتێك وەفاتی کرد خەلیفە (متوکل) وتی: (ئیمبراتۆریەتەکەم گەوهەرێکی گرانبەهای لەدەست چوو)[٢] هەر

---

[٢] مێژووی مۆسیقای کوردی ـ محمد حمه باقی .

لەناودارانی مۆسیقا لەو سەردەمەدا (ابراهیم کوڕی مهدی) کە لە باسێکیدا ئەڵێن: (کان عاقلاً دیناً ، ادیباً ، وشاعراً) هەروەها دەربارەی ئەڵێن (اشد خلق الله اعظاماً الغناء) کە توانیویەتی لە ڕێی ئامێری نای و دەنگی‌یەوە کاریگەرییەکی سیحری لە گوێگرانی بکات ، جێی باسە کە (ابراهیم کوڕی مهدی) منافسی (اسحاق موصلی) بووەو هەردووکیشیان ڕێچکەی تایبەتیان هەبووە لەگۆرانی‌و مۆسیقادا.

لەهەموو ئەمانە ناودارتر کە وەك مانگی چواردە لە ئاسمانی گۆرانی‌و مۆسیقای ئیسلامیدا ئەدرەوشێتەوە (زریاب)ە کە قوتابی (ابراهیم موصلی)و دواتر قوتابی (اسحاق موصلی) بووەو پێشنیاری ژەندنی ئامێری (عود)ی کرد بە (ریشە)و داهێنەری ژێی پێنجەمی ئامێری (عود) بوو ، دوای ئەوەی (اسحاق موصلی) مامۆستای زریاب زریابی بەخەلیفە (هارون الرشید) ناساند خەلیفە (هارون) زۆر سەرسام و دڵخۆش بوو بەعەزف و دەنگی (زریاب) و زۆر زۆر دەست خۆشی لێکردو بەخششی کرد.

دوای ئەوەی دەرکەوت کە ئاستی هونەری لەئاستی مامۆستاکەی بەرزترەو ئەگەری ئەوەی هەیە پێی مامۆستاکەی لای خەلیفەو کۆشکی خەلافەت لێژ بکات ، مامۆستاکەی ئیرەیی پێ بردو بەچاوی منافسەوە بۆی ڕوانی‌و (زریاب) یش وەك وەفاو ئەدەبێك بۆ مامۆستاکەی بەغدادو کۆشکی خەلافەتی بەجێهێشت بۆ مامۆستاکەی و کۆچی کرد بۆ ئەندەلوس‌و لە قورتوبە نیشتەجێ بوو وە لەوێش بەهونەرەکەی جێی خۆی کردەوەو لەماوەیەکی زۆر کەمدا ناوبانگی دەکردو لە قورتوبە

قوتابخانەی مۆسیقای دامەزراند ، چەندین قوتابی موسڵمان‌و غەیرە موسڵمانی هەبوو ، هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە ئەکەن گوایە هەندێ لە قوتابییەکانی لە ناوەڕاستی ئەورووپادا ئەژیان‌و ئەمانە بونە هۆی گواستنەوەی ئەو (تیۆرو داهێنان‌و دەستنووس‌و کتێبانە) ی کە زانا مۆسیقیەکانی شارستانیەتی ئیسلامی بەرهەمیان هێنابوو بۆ ئەورووپا .

هەروەها لە ناودارانی تری مۆسیقا لە سەردەمی عەبباسیەکاندا کە بە (کتێب ، نووسین ، توێژینەوە ، ئاواز دانان) و بەشدار بوون لە برەودانی ئەو هونەرە لەوانە (ابن رشد ، ابن سینا).

(کندی) لە ٢٥٢ ك کۆچی دوایی کردووەو ژمارەیەکی زۆر لە نامەو توێژینەوەی زانستی مۆسیقی لە دوای خۆی بەجێ هێشتووە لەوانە (رسالة في مدخل الى صناعة الموسيقى) (مختصر الموسيقى في تأليف النغم و صنعة العود) .

دوای ئەم فارابی لە سەدەی چواری کۆچی‌دا (٤) کتێبی لەسەر مۆسیقا داناوە کە بۆ چەندین زمان وەرگێڕدراوە لەوانە (الموسيقى الكبير) (احصاء الايقاع) ، (كتاب في النقد و الكلام في الموسيقى) .
فارابی لە نووسینەکانیدا (ڕۆژگاری مۆسیقای پێش ئیسلام بە ڕۆژگاری جاهیلیەتی مۆسیقا ناو دەبات).

هەروەها لەو ناودارانە (صفي‌الدين الارموي) (٦١٣هـ ـ ٦٩٣هـ) کە لە سەردەمی خۆیدا دەورێکی کاریگەری هەبووەو بە تازەکەرەوەی مۆسیقای ئیسلامی دائەنرێت لە دوای کاولکاریەکەی هۆلاکۆ (٦٥٦هـ) .

صفی‌الدین الارموی چەندین ئاوازی هەبووەو خاوەنی چەندین نوسراوو کتێبە لەوانە (کتاب الادوار) (الرساله الشرفیه).

## لەسەردەمی خەلافەی عوسمانیدا

لەناودارانی مۆسیقاو گۆرانی لەم سەردەمەدا (الشیخ سعد الموصلی) (١٧٧٦ ـ١٨٥١ز) (عثمان الموصلي (١٨٥٤ ـ١٩٢٣ز) کە لەگەڵ مۆسیقا ژەنیەکەشیدا قارئی قورئانی پیرۆز بووە . هەروەها (احمد زیدان) ١٩١٢ ئەمانەو چەندینی‌تر.

بەم شێوەیە مۆسیقاو گۆرانی لەشارستانیەتی ئیسلامیدا بونێکی واقعی‌و پراکتیکی هەبووەو ، کەلەپورێکی زۆر دەوڵەمەندی بۆ بەجێ‌هێشتووین کە تائێستاش لە سەدەی (٢١)دا هەموو رۆژهەڵات قەرزارباری هونەری گۆرانی‌و مۆسیقای ئیسلامین ، سەرجەم گۆرانی بێژو ئاوازدانەرە (عەرەب و فارس و تورك و کورد... هتد)ەکانی سەدەی رابردوو هەر لە (عبدالحلیم حافظ، ام کلثوم ، تا کاظم الساهر و شجریان ، ابراهیم تاتلسس ، عەلی مەردان ،....هتد ) کە ناودارەکانن تا ئاستەکانی تریش لەسەر میتۆدی گۆرانی و مەقاماتی مۆسیقای رۆژهەڵاتی ئیسلامی کارە هونەریەکانیان بەرهەم هێناوە .

# هونەری شێوەکاری

بەشێکی تری دیار لە هونەرە جوانەکان لەشارستانیەتی ئیسلامیدا بەشی هونەری شێوەکاری‌یە بەهەموو لقەکانی (وێنەکێشان ، سیرامیك ، پەیکەرتاشی ،خط ، زەخرەفە ، ئیشی دەست)ی‌یەوە کەپانتایی‌یەکی فراوانی لەم شارستانیەتەدا داگیرکردووە . هونەرمەندانی موسڵمان دەست ڕەنگینی‌و جێ‌دەستیان دیارەو چەندین پاشماوەی کەلەپوری وەك (خزف ، نسیج ، معادن ، التحف الزجاجیه ، فسیفساء ، سجاد ، الخشب ، الحجر و الجص) یان بۆ بەجێ‌هێشتووین.

ئەم هونەرە زۆر جێی گرنگی پێدان بووە لەشارستانیەتی ئیسلامیدا بەشێوەیەك چەندین قوتابخانەی هونەری شێوەکاری بونیان هەبووە، کەهەندێکیان بەناوی هۆز یان وڵات یان کەسی دامەزرێنەرەوە ناونراوە، لەو قوتابخانانەش (قوتابخانەی بەغداد بۆ وێنەکێشانی ئیسلامی ، قوتابخانەی مەغۆلی ، قوتابخانەی تەیموری (سەمەرقەند ، بەهزاد) قوتابخانەی وێنەکێشانی صەفەوی ، قوتابخانەی وێنەکێشانی هندی ، قوتابخانەی وێنەکێشانی تورکی) بەم شێوەیە شارستانیەتی ئیسلامی خاوەنی هەموو ئەم قوتابخانانەیە ، بەڵام ئەوەی جێی ئاماژە پێدانە قوتابخانەی بەغداد بۆ وێنەکێشانی ئیسلامی زۆر زیاتر دیارە لەچاو قوتابخانەکانی تر ئەتوانین بڵێین سەرچاوەی قوتابخانەکانی تر بووە .

لەو هونەرمەندە ناودارانەی لەم بوارەدا کاریان کردووە، ناودارترینیان (یحیی بن محمود بن یحیی بن ابی الحسن بن کوریها الواسطي) ناسراوە بە (الواسطی) ئەم ناودارە خاوەنی شێوازی

کارکردن‌و قوتابخانه‌ی تایبه‌تی خۆیه‌تی که به (شێخ المصورین) ناوزه‌د کراوه ، پاشان (جنید) که به‌یه‌کێك له چوار هه‌ره ناوداره‌کانی وێنه‌کێشان ناسراوه.

ئنجا هونه‌رمه‌ندی ناودار (بهزاد) که خاوه‌نی قوتابخانه‌ی (بهزاد)ه بۆ وێنه‌کێشان، له‌و ناودارانه‌ی تری هونه‌ری شێوه‌کاری (محمد زمان ، شه‌ره‌فخانی به‌دلیسی ، اغانویان ، ابن البواب ، ابن مقله ، ابن عزیز ، سلیمان بن عبید ، ابوتمین حیدره) ئه‌م هونه‌رمه‌ندانه جگه له‌کاری هونه‌ری تایبه‌تی خۆیان ئیشی هونه‌ری بیناسازی و ڕازاندنه‌وه‌ی ده‌ستنووس و کتێبه‌کانیان ده‌کرد ، بۆ نموونه له بیناسازیدا (قصر الحیر الشرقي ، قصر المدینة الزهراء ، قصر الخضراء ، قصر العباسي في البغداد ، قبة الصخرة ، مسجد الجزائر ، جامع القرطبة ، جامع الاموي الكبير في دیمشق ، مسجد القیروان في تونس ، فناء المنزل و الایوان في دیمشق) جوانترین نمونه‌ن بۆ ئاستی بیناسازی ئیسلامی له‌شارستانیه‌تی ئیسلامی‌دا ، له ڕازاندنه‌وه‌ی کتێب‌و ده‌ستنوسیشدا (کتاب صور الكواكب الثابتة ، کتاب البیطرة ، کتاب الاغاني ، کلیله و دمنه ، مقامات الحریري ، کتاب منافع الحیوان ، کتاب عجائب المخلوقات ، شه‌ره‌فنامه ، کتاب کشف الاسرار ،...هتد).

جێی باسه ئه‌م کتێبانه به‌وێنه‌ی جوان‌و ڕوونکه‌ره‌وه‌ی نوسینه‌کان رازێنراوه‌ته‌وه که‌ئێستا زۆربه‌ی هه‌ره زۆری له مۆزه‌خانه‌کانی ڕۆژئاواو هه‌ندێکیشی له مۆزه‌خانه‌کانی ڕۆژهه‌ڵات پارێزراوه‌و دراسه‌و توێژینه‌وه‌ی له‌سه‌ر ئه‌کرێت ئه‌وه‌تا مامۆستا (الکسندر پاپا دۆبولۆ) که

پرۆفیسۆره له جامعەی (السوربون) ، وه دامەزرێنەرو بەڕێوەبەری مەڵبەندی ئەثنوغرافی هونەری ئیسلامی‌یە لەهەمان جامعە ، هەروەها وێنەکێش و وێنەگری فۆتۆغرافیشەو بەشداری هەیە لە چەندین پێشانگای جیهانی ، مامۆستا (الکسندر) خاوەنی کتێبی (الاسلام و الفن الاسلامی) یە کە ئەم کتێبە (٦٣٠) لاپەڕەیەو (١١١٨) هەزارو سەدو هەژدە وێنەی ئیسلامی لەخۆگرتووە کە (١٧٤) سەدو حەفتاو چوار وێنەی رەنگاو ڕەنگن ، هەروەها خاوەنی (اطروحە)یە کە (بەناوی جمالیة فن الاسلامي) لە (٦) مجلد پێکهاتووەو (١٩٥٩) لاپەڕەیەو جائزەی ـ (دانیال بوفری) ساڵی (١٩٧٢)ی ئەکادیمیای فەرەنسی بۆ زانستە مرۆیی‌و سیاسیەکانی درایە .

ئەم مامۆستایە لەسەر هونەری ئیسلامی ئەڵێت (هونەری ئیسلامی پێش (٦ تا ٧) سەدە توانیویەتی بگاتە جوانی هونەری هاوچەرخ) کە ئەمە دانپیانانێکی کەم نی‌یە بۆ هونەری ئیسلامی و جێی شانازی‌یە.

سەبارەت بەهونەری شانۆش هیچ زانیاری‌یەکی ئەوتۆم دەست نەکەوتووە جگە لەهەندێك محاوەلە کەخۆی لەگێڕانەوەی چیرۆکدا دەبینێتەوە بەشێوەی نواندن بەڵام شانۆ بەواتا نوێیەکەی لەکۆتاییەکانی سەردەمی خەلافەتی عوسمانی‌دا لەساڵی ١٨٤٦ز لەوڵاتانی ئیسلامی بەدیار کەوت .

بەم شێوەیە هونەرە جوانەکان پانتاییەکی بەرچاوی لە شارستانیەتی ئیسلامیدا داگیر کردووە کە مایەی جوانکردنی زیاتری شارستانیەتەکەیە بەجۆرێك کەلەپورێکی دەوڵەمەندی بۆ بەجێ

هێشتووین ، کە لە ئەوروپا چەندین توێژینەوەی زانستی لەسەر کراوەو بڕوانامەی (ماستەرو دکتۆرا)ی لەسەر وەرگیراوە.

کەچی بەداخەوە تازە ئێمەی میراتگری ئەو هونەرە باس لە حەڵاڵ و حەرامی هونەر دەکەین و خەریکە بەدەستی خۆمان ئەو کەلەپورە دەوڵەمەندە دەسوتێنین .

# وەڵامی دوو پرسیار

هەندێك رای جیاجیایان هەیە بەرامبەر بەهونەری ئیسلامیو بەگومانو چەندین پرسیاریان لادروست بووە ، لێرەدا بە پێویستمان زانی وەڵامی ئەو دوو پرسیارە سەرەکیەیان بدەینەوە :

## پرسیاری یەکەم:

**ئایا تیۆرو هونەرێ بوونی هەیە بەناوی هونەرو تیۆری ئیسلامی؟**

**وەڵام: بەڵێ ، بەم بەڵگانەی خوارەوە:**

ا ـ خوای گەورە رەحمو بەزەیی رژاند بەسەر گرۆهی ئادەمیزاددا بەناردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەك بەرنامەی ژیان کە چەندین تایبەتمەندی وەك (گشتگیری ، جیهانی ، ئینسانی ، واقیعی ، ...) ی لەخۆ گرتووەو مایەی رێکخستنی کارو پێویستیەکانی ژیانی مرۆڤە ، بێگومان جوانی و جوانکاریش یەکێکە لەبەڵگەکانی خوای گەورەو رەگەزی بنەڕەتی هونەریشەوهۆکارێکە بۆ زیاتر گەیاندن و پیشاندانی جوانیەکانی گەردوونو سروشت ژیان بەسەرجەم مرۆڤەکانو پێداویستیەکە لە پێداویستیەکانی مرۆڤ ، کەواتە بێگومان ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەم لایەنەی فەرامۆش نەکردووە.

ب ـ ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەروەك چۆن تیۆرو بواری جیاجیای وەك (سیاسەتی ئیسلامی، ئابوری ئیسلامی، هزری ئیسلامی، ئەدەبی ئیسلامی...) بەرهەم هێناوە ئەوا تیۆرو هونەری ئیسلامیش بەرهەم دەهێنێت کە قورئانی پیرۆز سەرچاوەی یەکەمیەتی کە خۆی شاکارێك و موعجیزەیەکی گەورەی بەرزی هونەریە هەم لە رووی داڕشتنی

ئەدەبیو رەوانبێژییەوە هەم لە ڕووی چۆنیەتی یاسای خوێندنی (تجویدی قورئانی پیرۆزەوە) ، چەندین ئایەتی پیرۆزیش وەك لە سەرەتای ئەم نامیلکەیەدا ئاماژەمان بەهەندێکیداوە ڕەگەزی جوانی بۆ مرۆڤەکان بەرجەستە دەکاتو سەرنجی مرۆڤەکانی بۆ لای رادەکێشێت.

لەرووی تیۆریشەوە چەندین هەوڵ دراوەو هەیە بۆ نوسینەوەو هەڵگۆزینی بەرنامەو پرۆگرامو تیۆری هونەری ئیسلامی لە قورئانو فەرمودە شیرینەکانی پێغەمبەر ﷺ . لەو هەولأنەش :

١ـ کتێبی (التصویر الفنی فی القران)/ سەید قطب.

٢ـ کتێبی (منهج الفن الاسلامي) / محمد قطب.

٣ـ کتێبی (الاسلام والفن)/ د. محمود البستاني.

٤ـ کتێبی ( فلسفة الجمال) / د. مصطفی عبده.

٥ـ کتێبی (الدین و الابداع اثر العقیدة في منهج الفن الاسلامي) د. مصطفی عبده.

موسڵمانان وەك لەم نامیلکەیەدا ئاماژەمان پێکردووە لە مێژوودا هەوڵی زۆریانداوە بۆ بەرجەستەکردنی هونەری ئیسلامی کە لەو سەردەمەدا کاری هونەری زۆر بەتواناو ئاست بەرزیان بەرهەم هێناوە، بەلأم هەڵەی گەورە لەوەدایە کە نەتوانراوە هەموو ئەو وێنەو دەستنووسانە بپارێزرێنو نەتوانراوە ئاوازو گۆرانیەکان بەهۆکارێکی وەك نۆتەی مۆسیقا بپارێزرێ تاکو نەوەی دوای خۆیان سوودمەندبن لێیان.

## پرسیاری دووەم:

ئەو هونەرەی موسڵمانان پێشکەشیان کردووە لەمێژوودا لەئاستی پێویستدا نییەو گوزارشت لە تێڕوانینی گشتگیری ئیسلامی ناکات. ئایا دەگونجێت بەهونەری ئیسلامی لە قەڵەم بدرێت؟

وەڵام :

لێرەدا گەربچینەوە سەر پێناسەی هونەر کە هونەر: (دەربڕینێکی جوانکاری‌یە دەربارەی گەردوون‌و ژیان‌و مرۆڤو سروشت‌و پەیوەندی نێوانیان لەڕوانگەی ئەو هونەرمەندەی کە هەڵدەسێت بەکارە هونەری‌یەکە).

بەمانایەکی‌تر (هونەر زادەی هزرو تێگەیشتنی هونەرمەندە بۆ گەردوون‌و ژیان‌و مرۆڤ و سروشت) بەم پی‌یە ئەو هونەرەی کەموسڵمانان بەدرێژایی مێژوو لەشارستانیەتی ئیسلامی‌دا پێشکەشیان کردووە، زادەی هزرو تێگەیشتنی ئەو هونەرمەندە موسڵمانانە بووە بۆ ئیسلام‌و دواتریش لەو روانگەیەوە بۆ گەردوون‌و ژیان‌و سروشت لەگەڵ کاریگەری فتوای سلبی زۆربەی زانایان دەربارەی هونەر بەگشتی لەو سەردەمەدا.

ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە ئاست‌و توانای هونەری بەپێی هەل‌و مەرج‌و سەردەمەکان دەگۆڕێت ، لەگەڵ هەموو ئەمانەش موسڵمانان لەو چوارچێوە تەسکەی کە زانایان بۆیان هێشتبوونەوە هێشتا توانیویانە سەرکەوتووبن بە دانپێدانانی (دکتۆر ئەلکسەندەر پاپا دو بولو)

کەوتوویەتی: (جوانی لە هونەری ئیسلامیدا پێش (٦-٧) سەدە توانیویەتی بگاتە ئاستی جوانی هونەری هاوچەرخ).

کەواتە لەم تێڕوانینەوە لەگەڵ گەشەکردنی هزری ئیسلامی تیۆرو هونەری ئیسلامیش گەشە دەکات ، وەتا هونەرمەندی ئیسلامی خاوەن عەقیدەیەکی راست و دروستو تێگەیشتنێکی روونو جوان بێتو کارلێکی تەواوی لەگەڵ چەمكو مانا ئیسلامیەکان کردبێت زیاتر لە بەرجەستە کردنی هونەری ئیسلامی رەسەندا سەرکەوتوو دەبێت.

لێرەوە سەرنجی نووسەرانو هونەرمەندان بۆ ئەوە رادەکێشین کەگرنگی بەمێژووی شارستانیەتی ئیسلامی بدەن بەگشتی و هونەرەجوانەکان لەشارستانیەتی ئیسلامیدا بە تایبەتی بەمەبەستی زیندووکردنەوەی کەلەپوری ئیسلامیمان ، تاکو بوار برەخسێت بۆ هونەرمەندانو توێژەران توێژینەوەی لەسەر بکەنو زیاتر مۆرکو تایبەتمەندیەکانی هونەری ئیسلامی تیاهەڵگۆزنو لەگەڵ هزرو تێگەیشتنە نوێیەکان ، هونەری ئیسلامیش ببوژێننەوە بونیادی هونەری ئیسلامی رەسەنو هاوچەرخ بنێن .

رەحمەتی خواش لە ئیمامی غەزالی بێت کە لە وتەیەکیدا دەفەرموێت:

**( من لم يحركه الربيع وازهاره والعود وأوتاره فهو فاسد المزاج ليس له علاج ).**

**سبحانك اللهم و بحمدك**

# چەند نموونەیەک لە
# هونەرە جوانەکان
# لە شارستانیەتی ئیسلامیدا



قاپێکی رازاوەیە بە زەخرەفەی رووەکی لەسەدەی دەیەمی زایینیدا



گۆزەیەك لە شووشە



قاپێکی درێژکۆلەی رازاوە بە ئاڵتون



وێنەی ئاهەنگێکی مۆسیقی ساڵی ١٦٢٥



وێنەی بەهادر شای دووەمی مەغۆلی ساڵی ١٨٣٨



[illegible] ٧٨ ناسخ ( ١٦٢٥ ) [illegible] ( ١٦٢٥ )

**وێنەی لەبەرگرەوە ( ناسخ ) ١٦٢٥**

## سەرچاوەو پەراوێزەکان


١) قورئانی پیرۆز

٢) الفنون الاسلاميه / د.سعاد ماهر

٣) دراسات في تاريخ الحضارة الاسلامية العربية ، فصل السادس الحياة الفنية / د. سعد زغلول

٤) اثر الحضارة الاسلامية في الغرب / د. اسماعيل احمد ياغي

٥) جمالية فن العربي / د. عفيف بهنسي

٦) حديث عن الجمال في الاسلام / د. عماد الدين خليل

٧) مجلة فنون العربية

٨) الموسيقى في البغداد / محمود العبطة

٩) صفي الدين الارموى مجدد موسيقى العصر العباسي

١٠) من الوجهة النفسية اعلام الموسيقى و الغناء في قصور بني العباس / محمد محمود عبدالجبار الجبوري .

١١) تابلۆکانی شەرەفنامە / عبدالرقيب يوسف

١٢) مقامات الحريرى / ناهده عبدالفتاح

١٣) مدرسة بغداد في التصوير الاسلامي / د.زكي محمد حسن

١٤) مێژووی مۆسیقای کوردی / محمد حمه باقی .

١٥) الدين و الفن / د.حسن ترابى .



تابلۆی (٥١)ی دەستنووسی بابرنامە - وێنەی سەربازگە -

مۆزەخانەی نیشتمانی لە نیودلهی

ناوەندی ڕۆشنبیر